# مەزهەبی ئەهلی سوننە

لە تەکفیر کردنی کەسی دیاریکراو


زانای پایەبەرز

**سليمان بن ناصر العلوان**

خودای میهرەبان ئازاد و سەلامەتی بکات

# پێشەکی وەرگێڕان:

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحمدللّٰه وحده، والصلاة والسلام على من لا نبي بعده.

وبعد...

**بەرچاو ڕوونییەك لەسەر ووتەكانی زانای پایەبەرز:**

ئەوەی ئێمە هەڵساوین بە وەرگێڕانی، لە بنچینەدا تۆماری دەنگی زانای ناوبراوە، پا شان قوتابیانی **(شيخ العلوان)** هەڵساون بە نووسینەی تۆمارە دەنگییەكەی لە نامیلكەیەكی بچووكدا، ئێمەش دەستمان كردووە بە وەرگێڕانی نامیلكەكە، داوا كارم لە خوای پەروەردگار جەنابی زانای پایەبەرز لە زیندان ئازاد بكات و دڵ و سینەی بكات بە ئاوی سازگار و شنەی بەرەبەیان و بەهاری گوڵستان.

**سەرچاوەی عەرەبی:**

https://t.me/alalwan15/1675







# پێشەکی

الحمدلله رب العالمين، والصلاة والسلام على خاتم المرسلين، نبينا محمد، وعلى آله وصبحه أجمعين أما بعد:

پرسیار کراوە لە بەڕێز شێخ سلێمان کوڕی ناصر العلوان -خودای پەروەردگار بیپارێزێت- لە چاوپێکەوتنێکی کراوەدا، ئێمەش هەستاین بە جیا کردنەوە و تاککردنەوەی لەبەر گرنگی و گەورەیی باسەکە.

**پرسیار:** ئایا ڕاستە کە مەزهەبی ئەهلی سوننە کەسی دیاریکراو تەکفیر ناکەن؟

**وەڵام:** نەخێر ڕاست نییە، بەڵکو ئەهلی سوننە کەسی دیاریکراو تەکفیر دەکەن، بەڵام ئەگەر مەرجەکانی تەکفیری لە خۆ گرتبێت و ڕێگریەکانی تەکفیر بوونیان نەبێ.

ئەو کەسانەشی لەم بابەتانە تێدەگەن ئەوە زانایانی دەمەزراو و ڕۆچوو لە زانستەکانن، ئەوان ئەهلی حەل و عەقدن، هەر ئەوانن بەڵگەکان لەسەر شێوە دروستەکەی خۆی تێدەگەن، هەر ئەوانن کە دەزانن کوفرێکی ئاشکرا چۆنە و







شـــارەزان، دەزانن پێویســـتی و مەرجەكان چین، ئەوان دەزانن ڕێگرییەكانی تەكفیر هەیە یان نییە، ئا ئەوانن كە بۆیان هەیە حوكم و بڕیار بدەن لەسەر كەسی دیاری كراو.

جا ئەگەر كەسـێك قسـەیەكی كرد كوفرێكی دیار بوو و مەرجەكـانیشـی لە خۆ گرتبوو و ڕێگرییەكـانیش لە پێشـیدا نەبوون، ناگووترێ: ڕێبازی ئەهلی سـوننە تەكفیری دیاریكراو نـاكەن، بەڵكو ڕێبـازی ئەهلی سـوننە ئەم كەسـە بە كـافر دادەنێن.

بەڵام ئامان ئاگادارbن! ئاگاداربن! بەڕاسـتی هەندێ لە گەنجانی بچووك لە سـەرەتایی تەمەنی لاویدان، قسـە دەكەن و سەرەتایەتی لە داوا كردنی زانست، دێت و دەست دەكات بە تەكفیر كردنی كەســانی چاك و هەڵبژێردراو و زانـایـان لەژێر ناونیشانی ئەوەی **(كوفرێكی ئاشكرا لێی بینراوە)!.**

جا ئەگەر بێتوو پرسـیاری لێبكەیت كوفری دیار و ئاشـكرا چییە؟ دێـت بەڵگەیەكی گشـتیت بۆ دەهێنێـت ئەو خۆی لە بەڵگەكە تێناگات و لە دەق و واتا وێژەییەكەی تێنەگەیشـتووە






و لە چەمک و بیرۆکەکەی تێنەگەیشتووە، ڕەنگە چـــاولێکەری کەسێك بێت کە لە خۆی نەزانترە! جا ئەمە پێویستە وورییای بی و خۆی لێ بپارێزێ.

بێ گومان دەبێت کوفرەکەی ئاشکرا و ڕوون و دیار بێت، و ئیقامە حوجەی لەســەر کرابێت، و شــوبهە و گومانەکانی بۆ ڕەوانرابێتەوە.

خـاوەن زانســتەکـان ئەوانەی کە ڕۆچوون و پســپۆڕ و شــارەزان بە ووردی حەڵاڵ و حەڕام، ئەوانەی کە فەتوا دەدەن لەسەر نوێژ و ڕۆژوو و حەج و تەڵاق، هەر ئەوانن کە هەڵدەستن بە بڕیار و فەتوادان لەسەر بابەتی **(بە کافر کردن)**، بەڵام ئەوەی کە بێ توانایە لە شــارەزا بوون و کارامەیی لە بابەتەکانی نوێژ و ڕۆژوو و حەج و تەڵاق، ئەوە زۆر بێ توانا ترە لەوەی هەڵســێت بە بڕیاردان لەسەر تەکفیر.

هەندێ لە خەڵکی خۆیان دەپارێزن لەوەی فەتوا و بڕیار بدەن لەســەر حوکمی **(نییەت و نوێژ)**، بەڵام خۆیان ناپارێزن لە فەتوادان لە بابەتی حوکمی **(تەکفیر)** و بەدەرنانی موسـڵمانان






لە بازنەی ئیسلام! چونکە هەر کەسێك بە دڵنیاییەوە موسوڵمانێتی تێدا جێگیر بوو، ئەوا لە ئیسلام دەرناچێت مەگەر بە دڵنیاییەوە نەبێت، پێغەمبەر ﷺ ڕاستی فەرموو: (إِلَّا أَنْ تَرَوْا كُفْرًا بَوَاحًا، عِنْدَكُمْ مِنَ اللَّهِ فِيهِ بُرْهَانٌ)

**واتە:** مەگەر کوفرێکی ئاشکرای لێ ببینن و بەڵگەتان لای خواوە هەبێت لەسەری.

کاتێك ئەم فراوانییە دەبینین لەم بابەتەدا و بەکافر کردنی کەسێك کە شایەنی بە کافر کردن نییە زۆرێك لە گەنجان دەچنە سەر ئەم بابەتە کەوا لێی نازانن و کارامەییان لێی نییە، کاردانەوەی لێ کەوتۆتەوە لەلایەن کەسانی دیکەوە، کە دەڵێن: ئەم بابەتە هەڵدەوەشێنینەوە و بابەتی **(هەڵگەڕانەوە لە دین)** پوچەڵ دەکەینەوە و نایهێڵین.

کە ئەمەش کارێکی هەڵەیە، نە ئەمە بکە و نە ئەویتر، ئێمە ناتوانین چاوپۆشی لە کاردانەوەکان بکەین کە پووچەڵ کردنەوە حوکمێکی شەرعییە لە کاتێکدا کۆ دەنگی ئوممەتی لەسەرە، پێشەوا ئەبو بەکری سدیق خودا لێی ڕازی بێت کوشتاری هەڵگەڕاوەکانی کرد، بەڵام پرس و ڕاوێژی بە پێشەوا



عومەر و گەورە هـاوەڵان کرد خودا لێیـان ڕازیبێـت، پێشــەوا عومەر گفتوگۆ و ڕاوێژی لەگەڵ ئەبو بەکر کرد لەســەر ئەم بابەتە، ئەم بابەتەی تەکفیری دیاریکراو کارێکی گەورە و گرانە، تەنـانەت پێشــەوا ئەبو بکر ڕەزای خوای لێبێـت ئەهلی بەدر و ئەهلی بەیعەتی رضــوانی بۆ کۆکردەوە و ڕاوێژی پێ کردن بۆ ئەم بابەتە، خۆ پاڵی نەدابوو وەوە و ڕاکشێ لەسەر تەختەکەی وەکو حـاڵی ئێســتـای زۆرینەی گەنجـان، کەوا تەنـانەت **(چـل فەرموودەی نەوەوی)**یـــان لەبەر نییە، **(كتاب التوحيد)**یـــان لەبەر نییە، کتێبی **(عمدة الأحكام)**یـــان لەبەر نییە، وە **(مطلق)** و **(مقيـد)** لێـك جیا نـاکەنەوە، وە **(خـاص)** و **(عـام)** لێـك جیا ناکەنەوە و لە بەڵگە و دەلیلیش تێناگەن، پاشــان دەڵێت: ئەبو بکر تەکفیری ئەهلی هەڵگەڕاوەی کردووە!.

بەڵـێ، ئەو هەڵـگەڕاوەکـانـی بە کـافـر دانـا چـونـکە ئەو کەســێکی زانا بووە، وە ڕاوێژی بە ئەهلی بەدر کرد، ڕاوێژی بە ئەهلی رضــوان کرد، و ڕاوێژی بە زانـایـان و لە خواترســـان و پیاوچاکان کرد و گفتوگۆی لەگەڵ کردن.




ئەبو بەکر هەر بۆ خۆی زانایەک بوو، ئەگەر بێتو بە تەنها خۆشی بووایە ئەوا شایستە بوو کە ئەو بڕیارە بدات.

## جا پێویستە بە چەند قۆناغێك تێپەڕین:

**١)** ئەوانەی کە بابەتی بە کافر کردن هەڵدەوەشێننەوە، پشتیان بە ئیرجاء بەستووە، بەو بیانووەی کە دەڵێن: کەسەکە دەبێت **(استحلال)** یاخود **(جحود)**ی هەبێت ئینجا کافر دەکرێت; ئەمە ڕێبازی ئیرجائە.

**٢)** کۆمەڵە کەسانێکی تر کە **(مورجیئە)** نین، بەڵام دەڵێن: بۆ فراوانی زیاتر ئەم بابەتەی **(تەکفیری دیاری کراو)** هەڵدەوەشێنینەوە تاوەکو قۆناغێکی دیاری کراو.
کە ئەمەش کارێکی هەڵەیە، چونکە ئەمە بوێری دەدات بە کەسانێکی دیکە کەوا جوێن بدەن بە دینی پەروەردگاری جیهانیان، ئێمە کەس وا لێناکەین چاو نەترس و بوێر بێت بەسەر دینەوە، بەڵام ئەمە حوکمی خودایە دەیڵێین و باسی دەکەین، ڕاستە ئێمە ناتوانین هەڵسین بە جێبەجێکردنی حدودەکان، و حدودەکانیش جێبەجێ ناکرێن لەلایەن



کاربەدەستەکان نەبێت، تەنانەت ئەگەر هاتوو کاربەدەستەکە خراپە کاریش بێت، چونکە ئەوە داماڵینی تێدایە و دەبێتە مایەی شێواندن و ئاژاوەنانەوە، وە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: (مَنْ بَدَّلَ دِيْنَهُ فَاقْتُلُوْهُ)، واتە: هەر کەسێك دینەکەی خۆی گۆڕی ئەوا بیکوژن.

لێرەدا مەبەست لەوە نییە کە هەموو کەسێك هەستێت بە ئەنجامدانی حدودەکان، و هەر کەسێك مورتەد و هەڵگەڕاوەیەکی بینی بیکوژێ، بەڵکو دەبێت گفتوگۆ و ڕاوێژ بە ئەهلی حەلل و عەقد و زانایان بکەن، بەڵام سەرەڕای ئەوەش پێویستە لەسەر حوکمی خوداوە قسە بکەین.

**٣)** ئەوانەی کەوا تەکفیری هەموو کۆمەڵەیەکی خەڵکی دەکەن، وە ئەم کەسانە هیچ لە مەرجەکانی ئەهلی عیلم و جگە لەوەشیان تێدا نییە.

بۆیە ئێمە دژایەتی ئەم کۆمەڵە و ئەو کۆمەڵەی دیکەیش دەکەین، لەم کاتەدا ئەوەندە بەسمانە کە دەست بگرین بە مەزهەبی ئەهلی سوننە و جەماعە، کە دەفەرموون: (ئەگەر هاتوو مەرجەکانی تەکفیری لە خۆ گرتبوو و ڕێگریەکانی

تێـدا نەبوو ئەوە بێگومـان تەکفیر دەکرێـت)، **ئەم بـابەتەی تەکفیری دیاریکراو هەڵناوەشێنینەوە هەرگیز.**

وصلى الله وسلم على نبينا محمد واله وصحبه وسلم

